# پێشەوا (ابن قیم الجوزیة) ڕابەری لێکدەرەوەی دڵەکان

ئامادەکردنی: هێمن عەبدولعەزیز

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ

إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوذُ باللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هادِيَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إلَهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ.

يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً.

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً، يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيمًا.

اَمّا بَعْدُ:
فَإنَّ خَيْرَ الْحَديثِ كِتَابَ اللهِ وَخَيْرَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم" وَشَرَّ الْأُمُورِ مُحْدَثاتُها وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة.

فەقیهو موفتی و دووەمی شێخول ئیسلام (أبو عبد الله شمس الدين محمد بن أبي بكر بن أيوب بن سعد الزُّرعي) ناسراو بە (ابن قيم الجوزية) ڕەحمەتی خوای لێبێت، لە حەوتی مانگی سەفەری ساڵی (٦٩١)ی کۆچی لە دێی (زرع)، سەر بە شاری (درعا) لە نزیك دیمەشق لە دایکبووەو لە ساڵی (٧٥١)ی کۆچی وەفاتی فەرمووە.

(ابن القيم) پارێزەری سوننەو ڕاڤەکاری قورئان، لەبەر ئەوەی کە قوتابی (شيخ الإسلام ابن تيمية) بوو، زۆری لێ نزیك بوو، تاوای لێهات ئەم دوو کەڵە زانایە هاوبەندییەکی ئەوتۆیان لە نێواندا درووست ببێت کە ناویان بێت، بگوترێت: مامۆستاو قوتابیە زیتەڵەکەی.

## خێزان و هەڵکەوتنی شێخ و ڕووکردنی لە زانستی شەرعیی

(ابن القيم) ڕەحمەتی خوای لێبێت، لەکەش و هەوایەکی زانستیی لە خزمەت باوکی (الشيخ الصالح قيم الجوزية) گەورە بووە، هەڵبەت خانەوادەو خێزانی (ابن القيم)یش خێزانێکی پیرۆزو ڕوو دە خوا بوون، تێکڕای ڕۆڵەکانی ئەم خانەوادە خاوەنی زانستی شەرعی بوون، تا پێ بەپێ نەوەکانی لەسەر ڕچەو ئاکاری باوانیان مانەوەو لە سەردەمی خۆیاندا هەر یەك زاناو چاو ساغی ئەو سەردەمە بوون. هەروەها هەر لە باوکییەوە لە فەرائیزەکان بەهرەوەر کراوە، وە لە هێندێك لەو کتێبانەی کە باس لە ژیانی کەڵەپیاوان دەکەن، ئاماژە بە هێندێ لە خانەوادەی (ابن القيم)یش ئەدەن، لەوانە برازای شێخ وەکو (أبي الفداء عماد الدين إسماعيل بن زين الدين عبد الرحمن) و کوڕەکانی وەك: (عەبدوڵلاو ئیبراهیم)، هەموو لێکدا بە زاناو پێشەوایانی ئیسلامی ناسرا بوون.

(ابن القيم) ڕەحمەتی خوای لێبێت، بەوە ناسرا بوو کە هەر لە منداڵییەوە حەزی بە وەرگرتنی زانستی شەرعی و تێگەیشتن لە باقی زانستەکانی تر کردووە، هەروەك (الشِّهاب العابر) بە ڕەحمەت بێت، کە لە ساڵی (٦٩٧)ی کۆچی وەفاتی فەرمووە، ئەڵێت: چەندین جزمم لە زانستی شەرعی بۆ شێخ خوێنۆتەوە، کەچی لەهیچیاندا

لەگەڵمدا نەبووە ، کە هەڵبەت ئەویش لەبەر تەمەن بچووکی شێخەوە بوو، ئا بەم ئەندازە منداڵ بوو کە دەستی بە وەرگرتنی زانست کردووە.

## ئاکارو ڕەوشتەکانی شێخ

هەر کەسێ تاوێك (ابن القیم)ی ناسیبێت و کەمێك دەگەڵ بەرهەمەکانی ژیا بێت، ئەزانێت کەچ پێشەواو چاوساغێکی زانستی و بانەگەوازکارێکی دڵسۆزو لێبڕاو بوو بۆ خوا، شێخ تەمەنی خۆی لەوەدا خەرجکردووە کە دژایەتی شەڕو خراپەکاری کردووەو بانگەوازی بۆ خێرو چاکەکاری کردووە.

بۆیە جێگەی سەرنج نییە کە کەسێکی داوە دەزووێك لەگەڵ گەوهەری ئەو پیاوە پاکە ژیا بێت، گەواهی خواناسی و ڕەوشتپاکیشی دابێت.

بۆیە ئەگەر هێندێ لە ڕەوشتەکانی ئەم کەڵە پیاوە بە ژمارە بنووسین ئەوا ئەڵێین:

١. **شێخ پیاوێکی زۆر خۆشەویست و دڵگیر بوو:** لە نێو کۆمەڵگەکەی خۆیدا، بە تایبەت لای ئەوانەی کە خاوەن فەزڵ و پلەو پایەی زانستی بوون، لەوانە، (ابن کثیر) ئەڵێت، من خۆشەویستترین کەس بووم لە لای شێخ و ئەویش بۆ من هەر وەتر.

٢. **ئەو پەڕی ڕەوشتپاکی**: ڕەحمەتی خوای لێبێت، قەت ئێرەیی بەکەس نەبردووەو ئازاری کەسی نەداوە، عەیب و کەم و کوڕی لەکەس نەگرتووە، هەروەك (ابن کثیر) کە قوتابی ئەو بووە بەمجۆرە باسی کردووە.

٣. **زۆر حەزی بە وەرگرتنی زانستی شەرعی و کۆنووسکردن و موتالا کردن بووە:** هەروەك (ابن رجب) ی قوتابی شێخ باسی ئەکات، چۆن وا نەبێت لە کاتێکدا کە خۆی ئەڵێت: خەسڵەتی پێویستی بوون بە زانستی شەرعی و تەواو تێر نەبوون پێی، یەکێکە لە نیشانەکانی ئیمان و یەکێکیشە لە خەسڵەتی ئەهلی ئیمان.

٤. **تێکۆشان و تەقەلاکانی**: (ابن القیم) بە ڕەحمەتبێت، شەونخوونی و کۆشش و تەقەلا بێ وچانەکانی بوو کەوای پێکرد ببێتە ئەو ئالا بەرزەی ئیسلام، هەروەك وەسفیان

دەكرد كە شەوو ڕۆژ تالّب بەو زانستە شەرعییە بووە.

٥. **بوێری و چاو قـایمی**: (ابـن القـیم) بـە ڕەحمـەتبێت، زۆر جـوامێرو خـۆڕاگر بـووە لـە وەرگرتن و دانەوەی زانستی شەرعیدا، لە خوا زیاتر لـە كەسـی تـر نەترسـاوە، هـەروەك ئیمامی **شەوكانی** ئەڵێت: زۆر هەقبێژ بووەو لەكەس نەپرینگاوەتەوە.

٦. **لێبڕاوی تەواو**: خۆ ئەگەر بیزانیایە هەق لە غەیری خۆیدا وە دیار ئەكەوێت، ئـەوا بـۆ ئەوی دا ئەنا، بۆ نموونە، جێگیر كردنی وشەی (و) لە فەرموودەی (إذا سلَّم عليكم أهــل الكتاب فقولوا: وعليكم) ئینجا دەڵێت: ئەگەر ئەم هەقە لە غەیری منـدا وەدیـار كـەوت، ئەوەی من بخەنە ئەولاوە.

٧. **خۆ بەكەمگرتن**: هەر كەسێك كتێبەكانی بخوێنێتەوە، زۆر چاك ئەوە ئەبینێتەوە.

٨. **خـۆڕاگری**: خـۆراگری و دان بـە خـۆداگرتنی لەبـەردەم نـا ڕەحەتییـەكانی لـە پێنـاو خوادا، بەبێ ئەوە لە شتێ لە دینەكەی بسڵەمێتەوە، بگرە لەو مـاوەی كـە لەزیندانیشـدا بوو، هەر خەریكی وێردو خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزو موتاڵا كردنـی زانسـتی شـەرعی و تێفكرین بووە. هەروەك (ابن رجب)ی قوتابییشی شایەتی ئەم حاڵەی شێخ بووە.

## زوهدو بەندایەتیەكانی

لایەنێك لە لایەنەكانی ژیانی شێخ بریتی بووە لە زوهدو ترسان لەخواو كاركردن بـۆ ڕازی كردنی خواو خۆ ئامادەكردنی بۆ ڕۆژی دوایی.

هــەر كەســێكی نووســراوەكانی (ابــن القــیم) بخوێنێتــەوە، بەتایبــەت كتــێبی (مــدارج السـالكین)، بـۆی ڕووندەبێتـەوە كـە (ابـن القـیم) بـە ڕەحمـەتبێت، كـە بنـەوانێكی زۆر گەورەی لە بابی یەقین و خواناسـی و گەڕانـەوەی لای خـواو سـەرو سـامانێكی زۆری لـە نزیكبوونەوەی لە خوا لە دڵ و دەروونی خۆیدا پێكهێنابوو.

ئەوەت بۆ ڕووندەبێتەوە كە ئەم كەڵە پیـاوە چـەندە ئـەوینی خـوای تـاكو تـەنیا بـووە، ئەوینێك كە لە هیچ بەرنامەیەكی سۆفی و مۆفیەكی سەر ئەو زەویەت دەستنەكەوێ.

(ابن القيم) به ڕەحمەتبێت، وەك پەیوەندی خۆی لەگەڵ خوادا لە ڕێگەی بەندایەتیە باشەکانی دروستکردبوو، لە گەڵ خەڵکیشدا لە ڕێگەی ئەتوارو ئاکاری بەرزیەوە وێکهێنابوو.

شێخ (بكر بن عبدالله أبو بزيد) له کتێبی (ابن قيِّم الجوزية – حياته وآثاره) له لاپەڕە (٢٥) دا ئاوا باسی (ابن القيم) دەکات و لە چەند خاڵێکدا بەسەر شێخدا هەڵئەدات:

١. **زۆر یادی خوا کردنی**: ئەگەر نوێژی بەیانی بکردایە هەر لە شوێنی خۆی دەمایەوەو هەڵنەئەسا تا ڕۆژ دەبووەوە، کە پرسیاریشت لێی بکردایە، دەیفەرموو: (هذه غَـدْوَتِي، ولو لم أَتَغَدّ هذه الغدوة سقطت قواي) واته: ئەمە خواردنی گیانی منە، گەر نەیخۆم لە هێز دەکەوم. وە دەگێڕنەوە کە شێخول ئیسلامی مامۆستاشی هەر وا بوو!

سەبارەت بە زوهدەکانیشی، دەگێڕنەوە کە (ابن القيم) زاهیدترین قوتابی (شيخ الإسلام) بوو.

## مەینەتییەکانی شێخ

ئەگەر لە ژیانی پڕ گەوهەری شێخ وردەوە بین، ئەبینین کە خەڵکی لەو سەردەمە لە بیدعەو فیتنەو نەدانییەکی زۆردا ژیانیان بەڕێکردووە، هەر بۆیە زۆر جاران شێخ لە سەرو بەندی ڕووبەڕوو بوونەوەی بیدعەو ناشەرعیەکانی ئەو سەردەمەدا دووچاری نا ڕەحەتی دەبووەوە، بەرچاوترینیشیان مەسەلەی (شد الرحال) بوو، کە لەسەری کەوتە زیندانەوە.

هەروەك (الحافظ الذهبي) بە ڕەحمەتبێت، دەڵێت: "( ابن القيم) ڕوو بەڕووی گرتن و ئەشکەنجە دان بووەوە، ئەویش لە بەر نکوڵی کردنی زیارەتی گلکۆی پێغەمبەر ﷺ بوو لە بەر پیرۆزیەوە"، بە ڕووی ڕواڵەتیشەوە هەر تەنها ئەوجارە بوو کە لە ساڵی (٧٢٦) ی کۆچی، کەخۆی و شێخەکەی بوو سەبارەت بەو مەسەلەی (شد الرحال)ە هاویشترایە زیندانەوە، ئەو سەردەمە کێشەی (شدالرحال) گرفتێك بوو کە قازی ئەو شارە لە سەری وەدەنگهات و بڕیاری دا کە: هەموو ئەوانەی کە قوتابی شێخیشن و دەستیان وەبەر ڕا ئەگیرێت بگیرێن و بخرێنە زیندانەوە! ئەوە بوو زۆرێك لە قوتابیەکانیان گرتن و ڕاپێچی زیندانێیان کردن!، بە تایبەت ئەوانەی کە لە سەر ئەو ڕاو بۆچوونەی ئەمان بوون!.

هەڵبەت ئەمەش ئەگەڕێتەوە سەر ئەو کاریگەرییانەی شێخ کە لەسەر کۆمەڵگاکەدا هەیبوو.

دارو دەستەش هەڵسا بە کۆکردنەوەو سوتاندنی ئەو فەتوایەی کە ئەمان دابوویان.

هەتا (مەقەریزی) دەڵێت:

**جارێکیان (ابن القیم) سەبارەت بە قسە کردنی دەربارەی شەفاعەت و تەوەسسول بە پێغەمبەران، دەیگرن و دەیخەنە سەر گوێدرێژێکەوەو بە ناو دیمەشقدا ئەیگێڕن!**

وە جارێکی تریان کە (شیخ الإسلام ابن تیمیة) سەبارەت بە تەڵاقی سێبەسێ، کە دەیگوت: ( تەڵاقی سێبەسێ بە یەك لەفز، تەنها یەك تەڵاقی دەبەر ئەکەوێت)، فوقەهای دیمەشقیش لە کاردانەوەی ئەم فەتوایە، هەڵسانە سەر پێو ڕوو بەڕووی ئەم فەتوایە وەستانەوە، کاتێ کە ئەم فەتوایە دەگاتە (ابن القیم)ی قوتابی، ئەویش هەمان ڕا پەسند دەکات! فەقیهەکان قسەی زۆر ناشرین لە دەرهەق (ابن تیمیة) دەکەن و هەتا فەتوا ئەدەن کە دەبێ بگیرێت، ئەو و (ابن القیم) دەگرن و هەر یەك بە جیا ئەخەنە کونجی زیندانێکەوە، (ابن القیم) ئازاد ناکەن، پاش ئەوە نەبێ کە (شیخ الإسلام) لە زیندانی قەلعە لە ڕۆژی بیستی (ذي الحجة)ی ساڵی (٧٢٨) کۆچی، وەفات ئەکات، و ئەویش (دوای ئەزیەت و ئازارێکی زۆرو بێ حورمەتی پێکردنێکی زۆر لەگەڵ شێخەکەیدا، لە زیندانی (قلعة) لە ژوورێکی تاکە کەسیدا بوو، ئینجا ئازادی ئەکەن!. ئازادکردنی (ابن القیم)یش لە سی (ذي الحجة)، واتە: دە ڕۆژ پاش وەفاتکردنی مامۆستاکەی لە زیندان دەر دەچێت.

هەروەها (ابن رجب) بە ڕەحمەتبێت، دەڵێت: (ابن القیم) چەند جارێك گرفتار بووەو ئازارو ئەشکەنجەی چەشتووە.

### پەیوەندی شێخ لەگەڵ (شیخ الإسلام ابن تیمیة)ی مامۆستایدا

هەر ئەو کاتەی کە (ابن القیم) بە ڕەحمەتبێت، لە ساڵی (٧١٢)ی کۆچی دێتە دیمەشق و پەیوەندی دەگەڵ شێخول ئیسلامدا درووست دەکات. ئەمە بەردەوام ئەبێت، تا وەفات کردنی (ابن تیمیة)ی مامۆستای لە ساڵی (٧٢٨) دا، بەمشێوە (ابن القیم) شازدە دانە ساڵ هاودەمبووە لەگەڵ (ابن تیمیة)، ئەو ماوەی کە دەگەڵیشی دابوو، زانستێکی

بێ وێنەی لێ فێر بووەو فێری هوونەرێکی زۆر گەورەی زانستی شەرعی بووە.
ئەو پەیوەندییەی کە (ابن القیم) دەگەڵ مامۆستاکەی هەیبوو، کاریگەریەکی زۆری بۆ ڕەوتی (ابن القیم) خۆی هەبووە. چونکە شێخولئیسلام هەڵگری ئاڵای مەنهەجی سەلەف بوو، بۆیە ئەو ئاڵایە دوای وەفاتکردنی مامۆستاکەی ئەو ئەیگرێتە دەستخۆی، هەڵسا بۆ بڵاو کردنەوەو ڕوونکردنەوەی کتێب و سوننەت و بۆچوونەکانی سەلەف سالح.

(شەوکانی) بە ڕەحمەتبێت ئەڵێت: کاتێ کە (ابن القیم) شتێکی بۆ خەڵکی ڕوونبکردایە، قەت وەك مەزهەبیەکانی ئێستامان نەبوو، بگرە بەڵگە گەلێکی زۆری لابوو لەسەر هەر شتێك کە بیویستایە، وە زۆر ڕووی لە قیل و قال نەبوو، ئەگەر دەستی بە قسە کردن بکردایە بەڵگە گەلی وای ئەهێنا کە جگە لەخۆی کەسی تر بەڵگەی وا بەهێزو بەرچاوی لەمشێوە بەرچاو نەکەوتبێ، بەڵگەکان بەچەشنێك بوون کە خەڵکی دەستەوسان ئەبوون لەبەردەمی و دڵەکانیش ئەگەیشتنە دڵنیاییەوە پێی! کە من پێم وایە نهێنی ئەمکارەشی ئەگەڕێتەوە سەر هاوڕێیەتی و زۆر نزیکبوون و تێکەڵبوون و ژیان بەسەربردن لەگەڵ نا ڕەحەتیەکانی (شَيخ الإسلام)ی مامۆستاکەی.
بە شێوەیەکی گشتی (ابن القیم) کاری سەرەکی بریتی بوو لە بڵاو کردنەوەی سوننە، هەمیشە بەهۆی ئەو کەرەسە گرنگەی سوننەتەوە کە لای بوو، بۆچوونە دژەکانی پووچ دەکردەوە.
بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەش (ابن القیم) ڕەحمەتی خوای لێبێت، لاپەڕەیەك نەبوو لە مامۆستاکەی، بگرە زۆرێك لەو زانیاریانەی کە لای (ابن القیم) چنگ ئەکەوتن، لای مامۆستاکەی پەیدا نە ئەبوون، ئەمەش دەگەڕێتەوە سەر زۆر ڕۆچوونی بە نێو زاستەکان و بەهرەمەند بوون پێیانەوە.
هەروەها (ابن القیم) زۆر ڕقی لە چاولێکەری زانستی (التقلید) بووە، تا ئەیتوانی زۆر بەتووندی ڕوو بەڕووی ئەوانە ئەوێستایەوە کە موقەلليدو چاو لێکەری پیشەیان بووە.

### قسەو باسی زانایان سەبارەت بە شێخ

١. (ابن كثير) بە ڕەحمەتبێت، دەڵێت: (ابن القیم) گوێی بۆ فەرموودەکان شل کردووە،

خۆی بە زانستی شەرعی خەریککردووە، تا تواناییەکی باشی لە تێکڕای زانستە جۆراو جۆرەکان مسۆگەر کردووە، بە تایبەت زانستی تەفسیرو فەرمووده ناسی، کاتێ کە (شيخ تقي الدين ابـن تيمية) بە ڕەحمەتبێت، لە ساڵی (٧١٢)ی کۆچی لە میسر گەڕاوەتەوە، (ابن القيم) لە خزمەتی ماوەتەوە تاکو شێخ وەفاتی فەرمووە، لەو ماوەیە زانستی باشی لێ فێر بووە، دەگەڵ ئەمەش هەر بەوەندە نەوێستاوە، بگرە هەڵساوە زۆر لەو زانستانەی کە لای (شيخ الإسلام) قاتی بوون، ئەو ئەچوو پەیدای ئەکردن و خۆی لێ بەهرەوەر ئەکردن، تا ناوی بە تاقانەی زۆربەری زۆری هونەرەکان دەرکرد، دەگەڵ هەموو ئەوانە هێشتا خۆی بە تێنووی زانستەکان ئەبینیەوە، بۆیە بەردەوام و شەوو ڕۆژ بێ وچان بوو، نە ئەسرەوت و موتاڵای بەردەوامی هەبوو!

(ابن القيم) قورئانی زۆر بەجوانی و دەنگێکی خۆش ئەخوێندەوە، لەگەڵ ئەوەی بە ڕەوشتبەرزی ناوی دەرکردبوو بەجۆرێك خۆشی لە هەموو مسوڵمانێك دەهات و ئێرەییشی بە کەس نەدەبردو ڕقیشی لەکەس نەدەکێشا.

هەروەها (ابن كثير) بە ڕەحمەتبێت، بەردەوام دەبێت و ئەڵێت: من لەهەموو کەس لەو نزیکتر بووم، بۆیە منی لە هەموو کەس خۆشتر دەویست، لە بەر ئەوە نەمبینیوە کەلەم جیهانە کەسێك هەبێت لەو پیاوە بەندایەتی زۆرترو باشتر بووبێت، کە ئەچووە نوێژ، خەسڵەتێکی تایبەتی خۆی هەبوو، نوێژەکانی زۆر درێژ ئەکردنەوە، هەتا لە کڕنووش و سوژدەکانیشیدا زۆر ئەمایەوە، تا جاری وا هەبوو هاوڕێکانی سەرکۆنەیان دەکرد لەسەر ئەمە. کەچی ئەو تۆزقاڵێ نەئەسرەوت و بەردەوامتر ئەبوو لەم چەشنەی کە لەسەری بوو.

(ابن القيم) دەستننوسی زۆری گەورە زانایانی لابوو، کە لە نووسینی کتێبێك دا ئەنیشت، ئەوەی کە ئەو دەینووسی خەڵکی بەجۆرێك تێنوێتیان لەبەری ئەشکا، کە بە خوێندنەوەی دە کتێب لە کتێبەکانی سەلەف و خەلەف نە ئەشکا.

هەروەها (ابن القيم) ڕەحمەتی خوای لێبێت، خاوەنی بەندایەتی و شەونوێژێکی زۆر بووە، نوێژەکانی زۆر درێژ بوون، هەمەیشە زیکرو وێردەکانی لەسەر لێوان بوو، پێیەوە دیار بوو کە خوای زۆر خۆشئەوێت، بۆیە هەمیشە ڕوو لە تەوبەو ئیستیغفار بوو، بە جۆرێك بوو کە قەت چەشنی بەندایەتی وام لەکەسدا نەبینیوە، وە کەسم نەبینیوە کەلەو

زانا تـر بووبێـت و کەسیشـم نـەبینیوە کـە لـەو شـارەزا تـر بێـت لـە قورئـان و سـوننەو هەقیقەتەکانی ئیمان، هەر چەند خۆ ئەو بێ گوناه (معصـوم) نـەبوو، بـەڵام کەسـم وەك ئەو نەبینیبوو.

٢. (القاضي برهان الدين الزُّرَعي) دەڵێت: لە ژێر ئەو ئاسمانە نییە کەسێك لە (ابـن القـيم) زاناتر بووبێتن.

٣. (المزي) مامۆستای دەڵێت: (ابن القيم)، (ابن خزيمة) ی ئەو سەردەمەیە.

٤. ئیمـامی (الذهبي) ڕەحمـەتی خـوای لیێبێـت، دەڵێـت: (ابـن القـيم) فەقیـه و مـوفتی و هونەرو زمانزانە.

٥. (الصَّلاح الصَّفَدِي) دەڵێت: شێخ پێشەواو زانـا بـوو، خـەباتکارو ڕاژەوان و فـەرموودە زانبوو، فەقیهو شارەزای زمانی عەرەبی بوو، پیاوێك بوو جیاوازی نەبوو لەگـەڵ (شـیَخ الأسلام)ی مامۆستاکەی.

٦. (ابن رجب) رەحمەتی خوای لێبێت، دەڵێت: (ابن القيم) شارەزای هەموو مەزهەبەکان بوو، زۆر بەتوانا فەتوای ئـەدا، دەگـەڵ (شـیخ الإسـلام) زۆر نزیکبـوو و زانسـتی زۆری لێوەرگرتبـوو، وە خـۆی بـەهرەوەر کردبـوو لـە تێکـڕای زانسـتەکانی تـری ئیسـلام، زۆر شارەزابوو بە تەفسیر و بنچینەکانی ئاییینی ئیسلام و شارەزاییەکی باشی لـە فـەرموودە ناسـی و مانـاو تێگەیشـتنی هـەبوو، زۆر بلیمـەت بـوو لـە لێهـەڵێنجان (الإسـتنباط) لـە فەرموودەکان، وە زۆر شارەزای فیقهو زمانی عەرەبی بوو، وە شارەزای زانستی ئاخاوتن (علم الكلام) و ڕێزمانی عەرەبی بوو، وە زاناو شارەزا بوو بە زانستی ڕەوشت و قسەکانی ئـەهلی سـۆفیگەری و شـتە سـەیرو سـەمەرەکانیان، لەهـەر هوونـەرێك لـە هوونـەرەکان بگریت، ئەبینی کە شوێن پەنجەی ئەم کەڵە پیاوەی پێوە دیارە.

٧. (الحافظ ابن حجر) بە ڕەحمەتبێت، دەڵێت: شێخ زۆر بوێر بوو، زانستێکی بەرفراوانی لا بوو، شارەزای هەموو خاڵە ناکۆکییەکان بوو، ئاگاداری مەزهـەبی سـەلەف سـاڵح بـوو، خۆ ئەگەر (شيخ الإسلام) هیچ چاکەیەکی نـەبووبێتن تـەنها (ابـن القـيم) نـەبووبێت، ئـەوا تەنها پلەو شان و شکۆو گەورەیی ئەو بەمەندە بەس بوو بۆ ئەو.

٨. (السيوطي) بە ڕەحمەتبێت، دەڵێت: (ابن القيم) پۆڵێنکـاری (التصـنیف) و تێڕامـان و ئیجتیهادی زۆری هەبوون، تا بوو بـە یـەکێکێك لـە پێشـەوا هـەرە گـەورەکانی تەفسـیرو

فەرمووده و زمانی عەرەبی و..هتد

دیاره بۆچی کەوا (ابن القيم) گەشتۆتە ئەو پلەیە، کە ئەمە پشتیوانی خواو پاشان شون و تاقەتی خۆی بوو کە چۆن ئارامی گرت و نا ڕەحەتی لە پێناویدا چەشت، لەگەڵ ئەوەی کە خوا هۆشیاری و هێزی لە بەر کردنی پێ بەخشیبوو.

٩. (ابن ناصر الدين الدمشقي) بە ڕەحمەتبێت، دەڵێت: (ابن القيم) خاوەن زانستێکی زۆر بوو، بە تایبەت زانستی تەفسیرو لە گەڵ بنەڕەتیەکانی ژیربێژی (المنطق)و تێگەیشتن (المفهوم)یشدا بەینی خۆشبوو.

## مامۆستاکانی شێخ

دیاره ئەوەی کەوای لە شێخ کردبوو کە بگاتە ئەو پلە بەرزو بڵندەی ئیسلام، هۆشمەندیو لێبڕاوی مامۆستاکانی بوو، چون بۆ هەر زانستێك لە زانستەکان مامۆستایەکی تایبەتی هەبوو.

بۆ نموونە:

**یەکەم: مامۆستای لە بواری فەرمووده دا:**

١. (أحمد بن عبد الرحمن بن عبد المنعم بن نعمة، المقدسي، الحنبلي) کە ناسراو بوو بە (شهاب الدين، أبو العباس)، کە لە ساڵی (٦٢٨) ی کۆچی لە دایك بووەو لە (ذي القعدة)ی ساڵی (٦٩٧) کۆچی وەفاتی فەرمووە. جگە لەوە کە شارەزای فەرمووده بوو، هەروەها لێکدەرەوەیەکی چاکیش بوو لە بورای خەونەکان. هەروەك شێخ خۆی لە زۆربەی نووسینەکانیشیدا ئاماژەی پێ دەدات.

هەروەها هەر ئەوانەی کە لە بواری فەرموودەوە شێخ سوودی لێ بینیون بریتین لە:

٢. (ابن مكتوم: إسماعيل بن يوسف بن مكتوم بن أحمد بن سليم، صدر الدين، أبو الفداء، السويدي، الدمشقي، الشافعي، المقرئ، الْمُسْنِد، المعمر)، کە لە ساڵی(٦٢٣)ی کۆچی، لە دایکبووەو لە ساڵی (٧١٦)ی کۆچی، وەفاتی کردووە.

٣. (أيوب بن نعمة بن محمد، زين الدين أبو العلاء، المقدسي، الدمشقي، الكَحَّال)، کە لە

**ساڵی(٦٤٠)ی کۆچی، له دایکبووەو له ساڵی (٧٣٠)ی کۆچی، وەفاتی کردووە.**
٤. (ابن عبد الدائم: أبو بكر بن أحمد بن عبد الدائم بن نعمة، المقدسي، المُعَمِّر، مُسْنِدِ الشام )، **که له ساڵی(٦٢٥)ی کۆچی، له دایکبووەو له ساڵی (٦٢٦)ی کۆچی، وەفاتی کردووە.**

٥. (الحاكم: سليمان بن حمزة بن أحمد بن عمر بن أبي عمر، تقي الدين، أبو الفضل وأبو الربيع، المقدسي، الحنبلي)، **که قازی بوو له دیمەشق و له ساڵی (٦٢٨)ی کۆچی، له دایکبووەو له ساڵی (٧١٥)ی کۆچی، وەفاتی کردووە.**

٦. (علاء الدين الكِنْدِي الوَدَاعي: علي بن مظفر بن إبراهيم بن عمر بن زيد بن هبة الله، أبو الحسن، الكندي، الإسكندراني الدمشقي)، **ئەدیب و فەرموودە ناسی قورئان خوێن، نووسەری کتێبی** (ابن وَدَاعة)، **وە ناسراو بوو بە** (الوداعي) **که له ساڵی(٦٤٠)ی کۆچی، له دایکبووەو له ساڵی (٧١٦)ی کۆچی، وەفاتی فەرمووە.**

٧- (عيسى الْمُطَعِّم: شرف الدين، عيسى بن عبدالرحمن بن معالي ابن أحمد بن إسماعيل بن عطاف بن مبارك، المقدسي)، **که له ساڵی (٧١٩)ی کۆچی، وەفاتی کردووە.**

٨- (البهاء بن عساكر: القاسم بن مُظَفَّر بن نجم الدين بن محمود ابن أحمد بن محمد بن الحسن بن هبة الله بن عساكر، بهاء الدين، أبو محمد، الدمشقي، المعبِّر، الطبيب)، **که له سەفەری (٦٢٣)ی کۆچی، له دایکبووەو له شەعبانی (٧١٦) ی کۆچی، وەفاتی کردووە.**

٩- (القاضي بدر الدين ابن جماعة: محمد بن إبراهيم بن سعد الله ابن جماعة بن حازم بن صخر بن عبد الله الكناني)، **و خەڵکی شاری حەمای سوریایە، که له ساڵی(٦٣٩)ی کۆچی، له حەما له دایکبووەو له ساڵی (٧٣٣)ی کۆچی، له میسڕ، وەفاتی کردووە.**

١٠- (الحافظ الذهبي: محمد بن أحمد بن عثمان بن قايماز بن عبد الله الذهبي، التركماني، الدمشقي، أبو عبد الله، الحافظ)، **مێژووزانی ئیسلام و شێخی فەرموودەناسان، که له**

ساڵی(٦٧٣)ی کۆچی، لە دایکبووەو لە ساڵی (٧٤٨)ی کۆچی، وەفاتی کردووە.

١١- (محمد بن أبي الفتح بن أبي سهل البَعْلَبَكِّيّ، الحنبلي، شمس الدين، أبو عبد الله)، **پێشەواو عەللامەی فەرموودەناس، کە لە ساڵی(٦٤٥)ی کۆچی، لە دایکبووەو لە ساڵی (٧٠٩)ی کۆچی، لە قاهیرە، وەفاتی کردووە.**

١٢- (ابن الشِّيْرَازِي: محمد بن محمد بن محمد بن هبة الله بن محمد ابن يحيى بن بُنْدار بن مَمِيل، شمس الدين، أبو نصر، الفارسي، الشِّيرازي الأصل، الدمشقي، الْمِزِّي، الْمُسْنِد، الْمُعَمِّر)، **کە لە ساڵی(٦٢٩)ی کۆچی، لە دایکبووەو لە ساڵی (٧١٦)ی کۆچی، لە شەوی عەرەفە وەفاتی کردووە.**

١٣- (المزي: يوسف بن عبدالرحمن بن يوسف، القُضَاعي، ثم الكَلْبِي، الدمشقي، الشافعي، أبو الحجاج، جمال الدين، الإمام، العلامة، الحافظ)، **فەرموودەناسی شام کە لە ساڵی(٦٥٤)ی کۆچی، لە حەلەب لە دایکبووەو لە** (المزة) **گەشەی کردووەو لە سەفەری (٧٤٢)ی کۆچی، وەفاتی کردووە.**

**دووەم: مامۆستاکانی لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە:**

١٤.- (مجد الدين التونسي: أبو بكر بن القاسم، المرسي، التونسي، نزيل دمشق، مجد الدين)، **مامۆستای خوێندنەوەو ڕێزمانی عەرەبی، کە لە ساڵی(٦٥٦)ی کۆچی، لە دایکبووەو لە** (ذي القعدة) **ساڵی٧١٦)ی کۆچی، وەفاتی کردووە.**

**سێیەم:مامۆستاکانی لە فیقهدا:**

١٥. (شيخ الإسلام ابن تَيْمِيَّة: تقي الدين، أبو العباس، أحمد بن عبدالحليم بن عبدالسلام بن عبد الله بن محمد بن الخضر... بن تيمية، الحرَّاني، الدمشقي)، **پێشەواو زاناو فەقیهو حافیز و موفتی و شێخی ئیسلام، ئەو کەسەی کە هەموو تێکرا بە ناکۆکو ڕێککەوتوانی پێی ڕازین، کە لە ساڵی(٦٦١)ی کۆچی، لە دایکبووەو لە ساڵی (٧١٦)ی کۆچی، لە زیندانی**

قەلعە لە دیمەشق وەفاتی فەرمووە.

١٦- (المجد الحرَّاني: إسماعيل بن محمد بن إسماعيل، مجد الدين، أبو محمود، الحرَّاني، الفــراء، الحنبلي)، **كە لە ساڵی(٦٤٥)ی کۆچی، لە حەڕان لە دایکبووەو لە** (جمــادى الأولى)**ی لــە ساڵی (٧٢٩)ی کۆچی، وەفاتی کردووە.**

١٧- (شرف الدين بن تيمية: عبد الله بن عبد الحليم... بن تيمية، شرف الدين، أبو محمــد، الحراني، الحنبلي) **کە برای** (شيخ الإسلام ابن تَيْمِيَّة) **بوو. لـە سـاڵی (٦٦٦)ی کۆچـی، لـە دایکبووەو لە** (جمادى الأولى) **ی ساڵی (٧١٦)ی کۆچی، وەفاتی کردووە.**

**چوارەم: مامۆستاکانی لە فەڕزەکان:**

١٨- (أبو بكر بن أيوب، قَيِّم الجوزية) **کـە بـاوکێتی. وەك لـە پێشـەوە ئاماژەمـان دا کـە بـاوکی دەسـتێکی بـاڵای هـەبووە لـە هانـدان و هـەڵنانی شـێخ لـە بـە جـێ گەیانـدنی فەڕزەکان، هەروەها لەوانەی کە دەستی باڵایان هەبوو لە بێدار کردن و چـاو کردنـەوەی شێخ لە ڕووی فەڕزەکانەوە، بریتی بوون لـە:** (الصَّفَدِي و وابن حجرو الشوكاني و شــيخ الإسلام ابن تَيْمِيَّة).

**پێنجەم: مامۆستاکانی لە (أصول الفقه):**

١٩- (صفي الدين الهندي: محمد بن عبد الرحيم بن محمد، أبو عبد الله، الأرموي، الشافعي، العَلاَّمة، الأصولي)،**کە لە ساڵی(٦٤٤)ی کۆچی، لە هیند لە دایکبووە.**

**هەروەها هە سوودیشی بینیوە لە مامۆستاکەی کە** (ابن تيمية)**یە.**

**شەشەم: مامۆستاکانی لە زانستی یەکخواناسی (التوحيد)و بنچینەکانی دین:**

**دیسان بۆ ئەم زانستەش هەمدیس سوودی لـە** (شيخ الإسلام ابــن تَيْمِيَّـــة)**ی مامۆسـتای وەرگرتووە. هـەروەها لای** (الشيخ صــفي الــدين الأرمــوي المتقــدم)**ی خوێنـدووە. وە سوودیشی بینیوە لە:**

٢٠- (ابن سَيِّد الناس: محمد بن محمد بن محمد بن أحمد بن عبد الله ابن محمد بن يحيى... أبو الفتح، فتح الدين، ابن سيد الناس) **كـه لـه ئەسـلّا ئەندەلووسـی، پاشـان میسـری بـووە، پێشـەاو حـافیز بـووە، لـە سـاڵی(٦٧١)ی کۆچـی، لـە قـاهیرە لـە دایکبـووەو لـە سـاڵی (٧٣٤)ی کۆچی، وەفاتی کردووە.**

٢١- (ابن الزَّمْلَكَاني: كمال الدين بن علي بن عبدالواحد، الأنصاري)، **کە شافعییەو شێخی شافعییەکانیش بووە، ساڵی(٦٦٦)ی کۆچی، لە دایکبـووەو لـە سـاڵی (٧٢٧)ی کۆچـی، وەفاتی کردووە.**

**هەروەها خوێندوویەتی لای:**

٢٢- (ابن مفلح: محمد بن مفلح بن محمد بن مفرج، المقدسي، ثم الصالحي، الحنبلي، شمـــس الدين، أبوعبد الله)، **. کە لە ساڵی (٧٦٣) کۆچی، وەفاتی کردووە.**

٢٣- (فاطمة بنت إبراهيم بن محمود بن جوهر، البطائحي) **کـە بەعلەبەگییـەو ناسـراوە بـە دایکی موحەممەد، لە سـاڵی(٦٢٥) کۆچـی، لـە دایکبـووەو لـە سـەفەری سـاڵی (٧١١)ی کۆچی، لە تەمەنی هەشتاوشەش ساڵی وەفاتی کردووە.**

**سەرنجێك:**

**ئەگەر دیقەتی زۆربەی مامۆستاکانی شێخ بدەین، ئەتوانین چەند سەرنجێکیان لێوەربگیرن:**

**١. زۆربەی زۆری شێخەکانی (ابن القيم) ئەگەر هەمووشیان نەبووبن، ئەبینین کە (حفاظ) و پێشەوایانی بەناو بانگبوون، ئەوانە بوون کە لە پسپۆرییەکانی خۆیان ناوبانگی زۆریان بووە.**

**٢. ئەو مامۆستایانەی شێخ، لە باری زوهدو وەرەع و خۆ بەکەمگرتن و ئاکـارو ڕەوشـتی جـوان و ئیجتیهـاد کـردن لـە بەندایەتیـدا... هتـد پلـەو پایەیـەکی زۆر بـەرزو بڵنـدیان هەبووە.**

٣. تێكڕای ئەو شـێخانەی (ابـن القـيم) ديمەشـقی بـوو ون، لـەوێ لـە دايـك بـوون و هـەر لەوێش وەفاتيان فەرمووە، هـەر ئەمـەش بـوو وای لـە شـێخ كـردووە كـە بـۆ وەرگـرتنی زانستی شەرعی زۆر بە دەگمـەن بـيری لەگەشـتكردن بـۆ ئـەمولآت و ئـەوولآت بكاتـەوە، ئەويش وەك گوتمان لەبەر ئەوە بوو كە ئەو زانستەی كە پێويسـت بـوو كـە (ابـن القـيم) دەبەری بوەستێت، لە شارەكەی خۆی چنگی ئەكەوت.

(ابن القيم) لە گەورە زانايانی ديمەشق بەهرەوەر ببوو، بۆيە ئـەبينين زۆر زەحمـەت بـوو كە (ابن القيم) لە باقی زانستەكانەوە هەڵوەستە بكات و تێگير ببێت.

## ئەهميەتدانی شێخ بە كتێب و دەوڵەمەندبوونی لە زانستە جۆراو جۆرەكان

گرنكترين لايەن لە ژيانی زانايان بريتييە لە بـوونی زۆرتـرين چەشـنی كتێـب لـە تێكـڕای زانستەكان، كە ئەبێ لە كتێبخانەكەياندا مسۆگەر ببن.. چـون گومـان لـەوە دا نييـە كـە بوونی زۆری كتێب لای زانايان چاكترين زەمينەن بـۆ شـارەزا تربـوون و هۆشـيار بـوونی باشتر لە زانستە جۆراو جۆرەكان.

هەروەك چەشنی ئەو كتێبەش كە پێويستە زانايان بيكەن بە مەرجی خۆيان ئـەبێ لايـان چنگ بكەوێت. وە توخمێكی گرنگيش ئەبێت لە پێكهاتەی ئەو زانايە.

**هەروەك عەللامە** (بدر الدين بن جماعة) كاتێ باس لە ئـادابی وەرگـرتنی زانسـتی شـەرعی دەكات و دەڵێت: ( بابای تالێبی عيلم، لەسـەرييەتی كـە ئەهميـەت بـدات بـەوە كـە ئـەو كتێبانەی كە پێويستن بۆی، پەيايان بكات و موتالآيان بكات، بيانكڕێ، يان بيـانخوازێ، چون ئەمانە ئاليەتی وەدەستهێنانی زانستی شەرعين، بەڵام ئەبێ ئەوە بـزانن كـە تـەنها كۆ كردنەوەی كتێب، بەس نييە بۆ پێشكەوتن لە زانستی شەرعی، بەڵكو ئەبێت، گورجو گۆڵ بێت لە موتالآكردنيان و كردو كۆش كردن لە خوێندنەوەو سوود لێبينيان و..هتد)

(ابن كثير) بە ڕەحمەتبێت، ئەڵێت: شێخ ئەهميەتی بـە كتێبێـك ئـەدا و موتـالآی ئـەكرد، كەوا شتێكی تيا بەديكرايە كە لە دە كتێبان چنگ نەكەوتايە.

**هەروەها** (ابن رجب الحنبلي)، ئـەڵێت: (ابـن القـيم) بـە ڕەحمـەتبێت، زۆر زانسـتی خـۆش ئەويست و ئەهميەتی بە كتێب ئەدا، كتێبی وای لا دەست ئەكەوت، كـە زۆر زەحمـەتبوو

خەڵکی چنگیان بکەوتایە.

**هەروەها** (الحافظ ابن حجر) **دەڵێت:** (وكان مُغْرىً بجمع الكتب، فَحَصَّل منها ما لا يُحْصَر)، (ابن القيم) بە ڕەحمەتبێت، فرچکی بە کۆ کردنەوەی کتێب وەر گرتبوو، شتی وای لێ هەڵئەهێنجان کە زۆر زەحمەت بوو لێی هەڵبهێنجرێت.

ئەمەیە (ابن القيم)ی بەرزوبڵندو شارەزا، بە ڕەحمەتبێت، کە چۆن شەیدای کتێب بوو، کە ئەو تەنها بۆ کۆ کردنەوە کۆی نەکردبووەوە، بگرە مکوڕ بوون و زۆرتر بەرەو پێش چوونی زانستی شەرعی خۆی بەو داینەمۆو تین و تەوژمەی ئەو هەموو کتێبە ئەبینیەوە.

(ابن القيم) بە ڕەحمەت بێت، زۆر دەوڵەمەند بوو لە کتێب نووسیندا، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە شێخ لە بەردەم زانستەکان زۆر بەوەفاو ڕاستگۆ بوو، هەر کە سەرنجی هەر کتێبێك لە کتێبەکانی بدەیت، هەستدەکەیت کە بەڕاستی ئەم کەڵە پیاوە دەریایەکی بێ بنی بەڵگە شەرعییەکان بووە.

هەر بۆیە ئەگەر سەرێکبدەین لە قوتابییەکانی شێخ و چاوێك بەو دەقانە بخشێنین کە باسیان لە شێخ کردووە، سەرت سوڕ ئەمێنیت لە گەورەیی و بلیمەتی ئەو کەڵە پیاوە، لەوانە:

۞ (ابن رجب) کە قوتابیەکی شێخ بووە، ئەڵێت: (ابن القيم) زۆر حەزی بە زانستی شەرعی و موتاڵا کردنی کردووە، کتێبی وا ناوێزە (نادر) ی لە لا هەبوو کە زۆر زەحمەتبوو کە خەڵکی بتوانن وەدەستی بێنن.

۞ (ابن كثير) بە ڕەحمەت بێت، ئەڵێت: شێخ شتی وای لە کتێبەکانی دا تۆمار کردبوو، کە خەڵکی زۆر زەحمەت بوو بتوانن لە زۆربەی زۆری کتێبەکانی سەلەف و خەلەفدا بەدەستیان بکەوێت.

## گەشتەکانی شێخ

(ابن القيم) وەك باقی زانایان چەند گەشتی بۆ وەرگرتنی زانستی شەرعی کردووە،

لەوانە، چەند جارێك چووەتە قاهیرە، هەروەك (المقریزی) دەڵێت: چەند جارێك شێخ هاتۆتە قاهیرە، كە جارێكیان بە یەكەوە باسی كۆمەڵە پزیشكێكی میسرپیمان كردووە، هەروەها چۆتە قودس و لەوێدا زانستی شەرعی گوتۆتەوە.

شێخ زۆر حەزی بە حەجكردن كردووە، هەروەك لە هێندێك لە كتێبەكانی ئەوەی باسكردووە، هەروەك (ابن رجب) یش بە ڕەحمەت بێت ئەڵێت: شێخ چەندین جار سەردانی ماڵی خوای كردووەو زۆر جارانیش لە نزیك مەككە ماوەتەوە، بۆیە خەڵكی مەككە زۆر باسیان لە گەرم و گوڕی و بەندایەتییەكانی شێخ كردووە، وە باس ئەكەن كە شێخ بە جۆرێك حەزی بە تەواف بووە كاتێ كە تەوافی دەكرد خەڵكی لە گەرم و گوڕی و تامەزرۆیی شێخەوە زۆر سەرسام دەبوون.

هەڵبەت یەكێك لە خاسیەتەكانی تاڵبی عیلمیش بریتیە لە گەشتكردن لە پێناو زیاتر وەرگرتنی زانستی شەرعی، ئەمەش كارێكە كە هەرچی تاڵب بە زانستی شەرعی بێت، ئەبێ ئەم شوێن و ئەو شوێن بكات و مەیل پەیدا بكات لە گوێگرتن لە زانایان. كە ئەمە خۆی داب و نەریت و خاسەیتی هەموو زانایان بووە.

ئامانجیش لە گەشتكردن كە وەك (الخطیب البغدادي) بە ڕەحمەت بێت ئەڵێت، تەنها بۆ دووشتە:

**یەكەم: گەیشتن بەو پەڕی سەنەد (علو الإسناد)**: چون چەندی لەسەنەدەكان وە نزیككەویت هێندە ئەگەیتە ئەنجام، بۆ نموونە كە باس لە ئیمام بوخاری ئەكەن، ئەڵێن: گەیشتبوو بەو پەڕی سەنەد، چونكە نێوان پێغەمبەر ﷺ و ئیمام بوخاری لە كەسێكەوە تا سێكەس بووە، كە ئیمام بوخاری فەموودەی پێغەمبەر ﷺ ی لێ وەرگرتوو ون. بەڵام ئەگەر سەیری ئەوانەی دوای بوخاری بكەیت، ئەبینین زنجیرەی سەنەدەكان زۆر تر بوو ون.

**دووەم: گەیشتن بەوانەی كە زانستیان لە سینەدابووەو پاراستوویانە، وە یادداشتكردنی** زانستەكانیان و سوود بینین لێیان:

بە ڕەحمەت بێت دەڵێت: خۆ ئەگەر ئەو دووشتە لە وولاتی خۆتدا هەبوون، ئەوا گرنگ نییە كە پێ بۆ وڵاتان هەڵگریت و گەشتیان بۆ بكەیت.

بەلاّم سەبارەت بە (ابن القيم) بە ڕەحمەتبێت، چون ئەو دوو شتە لـە وولاّتەکـەی خـۆی چنگ ئەکەوتن، بگرە خەڵکی بۆ ئەو دووشتە ئەهاتنە دیمەشق بۆیە ئەبینین کە گەشـتی زۆر کەمی هەبووە.

سەبارەت بەوەی یەکەمیان: (ابن القيم) چاکتر ئەیتوانی کـە لـە ولاّتـی خـۆی وەدەسـتی بێنێت، بۆیە گەشتێك گەر ئەو کردبێتی بۆ ئی دووەمیان بووە نەك یەکەمیان، کە بریتیە لە چاو کەوتن بە زانایان و کۆبوونەوە دەگەڵیان و سوود لێبینینیان ، گومـانیش لـەوەدا نییە کە گەشت کردن لەو پێناوەدا شتێکی پیرۆزە. بەلاّم ئەمەش بـە مـەرجێك بـوو وەك (خەتیبی بەغدادی) دەڵێت: ئەگەر ئەو جۆرە زانینانە لای خۆت چنگ نەکەون.

## کارو ئەرکەکانی ڕۆژانەی لە ژیانیدا

شێخ لە ژیانیدا خەریك بە هێندێ کارو ئەرك بووە، لەوانە:

١. گوتنەوەی وانەی شەرعی.

٢. بەر نوێژی کردن.

٣. گوتار خوێندن.

٤. فەتوا دان.

٥. نووسینی کتێب و پۆلێنکردنی زانستەکان.

## قوتابییەکانی شێخ

١. (ابن رجب الحنبلي)، بـە ڕەحمـەتبێت، یـەکێکبووە لـە قوتابیـەکانی شـێخ، کـە (ابـن رجب) خۆی دەڵێت: بەشداری کۆڕەکانی شێخم کردووەو گـوێم لـە هـۆنراوە نوونیەکـەی کە ناسراوە بە (القصيدة النونية)گرتووە. (ابن رجب) لە ساڵی(٧٣٦)ی کۆچی، لـە بەغـدا لە دایکبووەو لە ساڵی (٧٩٥)ی کۆچی، وەفاتی کردووە.

٢. (ابن كثير)، بە ڕەحمەتبێت، دەڵێت: من یەکێك بووم لە باشـترین هاوڕێکـانی شـێخ و زۆریشم خۆشویستووە. (ابن كثير) لە ساڵی(٧٠١)ی کۆچی، لە دایکبووەو لـە شـەعبانی ساڵی (٧٧٤)ی کۆچی، وەفاتی کردووە.

٣. (الذهبي)، به ڕەحمەتبێت، کتێبێکی تایبەتی لەسەر ژیاننامەی شێخ نووسیوە بە ناو نیشانی (المعجم المختص)، دەوێدا باسی گەورەیی و بە توانایی شێخەکەی ئەکات.

٤. (ابن عبدالهادی)، به ڕەحمەتبێت، هەروەك (ابن رجب) دەڵێت: خەڵکێکی زۆر لە زانایان (ابن القیم) بە گەورە دا ئەنێن و دەرسیان لە لادا خوێندووە، لەوانە: (ابن عبدالهادی)و زۆرێکی تر لە زانایان.

٥. (فەیرۆز ئابادی)، بە ڕەحمەتبێت کە خاوەنی کتێبی: (القاموس المحـــيط)ە، هەروەك شەوکانی بە ڕەحمەتبێت، باس لە فەیرۆز ئابادی دەکاو دەڵێت: لە ساڵی (٧٥٥)ی کۆچی چۆتە دیمەشق و گوێی لە سەدان زانای وەکو (السبکی)و (ابن القیم) گرتووە. (فەیرۆز ئابادی) لە ساڵی (٧٢٩)ی کۆچی، لە شیراز لە دایکبووەو لە ساڵی (٨١٧)ی کۆچی، وەفاتی فەرمووە.

٦. ئیبراهیم و برهانوددینی کوڕی.

٧. (الصَّفَدِي: خليل بن أَيْبَك بن عبد الله، الصَّفَدِي، صلاح الدين، العلامة، الأديب، البارع)، کە لە ساڵی(٦٩٦)ی کۆچی، لە دایکبووەو لە شەووالی ساڵی (٧٦٤)ی کۆچی، وەفاتی کردووە.

٨- (علي بن الحسين بن علي بن عبد الله، الكناني، البغدادي، المقرئ، الحنبلي، زين الدين)، کە لە ساڵی(٦٩٣)ی کۆچی، لە دایکبووە.

٩. (السُّبكي: علي بن عبد الكافي بن علي بن تمام بن يوسف بن موسى بن تمام، الأنصـــاري، الخزرجي، تقي الدين، أبوالحسن)، کە لە ساڵی(٦٨٣)ی کۆچی، لە دایکبووەو لە ساڵی (٧٥٦)ی کۆچی، وەفاتی کردووە.

١٠. (ابن عبد الهادي: محمد بن أحمد بن عبد الهادي بن يوسف بن محمد بن قدامة، المقدسي، الحنبلي، شمس الدين، أبو عبد الله)، كە لە ساڵی(٧٠٥)ی كۆچی، لە دایكبـووەو لـە (جمادى الأولى) ساڵی (٧٤٤)ی كۆچی، وەفاتی كردووە.

١١. (محمد بن عبد القادر بن محيي الدين بن عثمان بن عبد الرحمن، الجعفـري، النابلسـي، الحنبلي)، كە لە ساڵی(٧٢٧)ی كۆچی، لە نابلس لە دایكبووەو لە ساڵی (٧٩٧)ی كۆچـی، وەفاتی كردووە.

١٢ محمد بن محمد بن الخضر بن سمرى، الشمس، الزبيري، الغزي، الشافعي)، كە لـە ساڵی(٧٢٤)ی كۆچی، لە قودس لە دایكبووەو لـە سـاڵی (٨٠٨)ی كۆچـی، وەفاتی كردووە.

١٣. (المقري: محمد بن محمد بن أحمد بن أبي بكر، القرشي، الْمُقْرِي، التلمسان)، كە لە ساڵی (٧٥٩)ی كۆچی، وەفاتی كردووە.

## بەرنامەو خاسیەتەكانی شێخ لە نووسینی كتێبدا

**یەكەم**: هەمەلایەنەو هەمەچەشنە لە نووسینەكانی.

**دووەم**: گرنگـی ئـەو بابەتانـەی كـە (ابـن القـیم) قسـەیان لەسـەر ئـەكات و سـەنگینی و قورسایی ئەو بابەتانەی كە شێخ بۆی ئەچوو.

**سێیەم**: پەیوەستكردنی بابەتەكانی بە واقیع و ئەو گرفتانـەی كـە لـەنێو كۆمـەڵگادا بـاو بوون یان باون.

**چوارەم**: پشتبەسـتن بـە بەڵگەگـەلێكی زۆر، بەتایبـەت ئـەو بەڵگانـەی كـە لـە قورئـان و سوننەتەوە دەوڵەمەندن.

**پێنجەم**: پشتبەستن بەو بەڵگە ئەقڵیانەی كە ئـەقڵی سـەلیم دەرقـەتی وەرگـرتنی دێـن، لەپاڵ ئەو بەڵگە ڕاست و شەرعییانەی كە لەشەرعدا هەن.

**شەشەم**: هەنگاوگیری (التدرج) لە هێنانەوەی بەڵگە نەقلییەکان و ڕیزبەندکردنیان بەپێی شوێن و ئەهمیەتی باسەکە.

ئەبینین کاتێ کە شـێخ بەڵگـە بـۆ شـتێك ئەهێنێتـەوە، ئـەبینین ڕیزبەندییـەك درووسـت ئەکات، سەرەتا لە قورئانەوە دەست پێئەکات، پاشان لە سوننەت و پاشـان لای یـارانی پێغەمبەر ﷺ ... هتد.

بەرچاوترین کتێبی کـە هـەموو ئـەو شـێوازەی کـە شـێخ هـەیبووە لـە نووسـین و بەڵگـە گەلەکانییەوە بەرجەستە ئەبوون، بریتییە لـە کتـێبی (اجتماع الجيوش الإسلامية). ئینجـا دوای بەڵگەکانی سوننەت، بەڵگە لە قسەی تـابعین ئەهێنێتـەوە، ئینجـا بەڵگـە لـە چـوار پێشەواکەی شوێنکەوتەی تابعین ئەهێنێتەوە.

**حەفتەم**: خۆ پاراستن لە شوێنکەوتنی مەزەبێکی دیاری کراو ، یان ڕایـەکی دیـاری کـراو کە موخالیفی کتێب و سوننەتە.

**هەشتەم**: نەفـەس درێـژی لـەو شـتانەی کـە ئەینووسـی، وە فـراوانگیری و دیـار کردنـی مەبەستەکانی لە نووسینەکانیدا.

**نۆیەم**: جوان ڕێزکردن و دابەشکردنی زانستەکان.

**دەیەم**: شیرینی شێوازەکانی و جوانی دەستەواژەکانی و شیرینی مەنتیقەکانی و جـوانی شیکردنەوەکانی.

**یازدەیـەم**: پشتبەسـتنێکی زۆر بـە فـەرموودەکان و واقیعـە مێژووییـەکان و بلیمـەتی بەشایەتگیر کردنییان.

**دوازدەیەم**: پشت بەستن بە ئەزموونە تایبەتییەکانی، وە بە خیبرەکانی بۆ پشتگرتن لـە بۆ چوونەکانی.

**سـێزدەیەم**: خـۆ بەکـەمگرتن بـە خـۆ بەکـەمگرتنێکی تـەواوو دیـار کردنـی سـوود و سەرنجەکانی لە هەر باسێك کە ئەیکاتەوە.

**چواردەم**: مکوڕ بوون لە یـەکلا کردنـەوەو بنبەسـتکردنی ئـەو مەسـەلانەی کـە جێگـەی ناکۆکی زانایان و تەرجیح دانی کۆتاییان.

**پازدەیـەم**: نەرمینوانـدن دەگـەڵ نـا حـەزەکانی و مکـوڕ بـوون بـۆ گەیشـتن بـە خێـرو چاکەکان، وە گەیشتن بە ڕێنمایی و سوود لێبینینان.

**شـازدەیەم**: وردبـینی لـە هەڵبـژاردنی نـاوو و ناونیشـان بـۆ کتێـب و نووسـینەکانی، وە موراعاتکردن لە بەراوردکردن لە نێوان ناوو ناوەڕۆکەکانەوە.

بۆ نموونە: کاتێك کە باس لە بەهەشت ئەکات، ئەبینین زۆر وشەی نەرم و جوان و شیرین هەڵئەبژێرێ و بەکاری دێنێ. خەڵکی بـۆ هەڵـدێنێ مـەیلی بـۆ ئـەبزوێنێ، تامـەزرۆی پـێ ئەهێنێ، داخوازی بۆ وەدەستدێنێ، هەرکەس چاو بە (حادي الأرواح إلى بلاد الأفراح)دا بخشێنی، زۆر بە چاك شایەتی ئەم ڕاستییە دێنێ. یان سەرنجی کتـێبی (روضة المحــبين) بدەیت، ئەودەم باوەڕ دێنی، کـە چـەند وەدوای کتێبەکانییـەوە عـەوداڵ بیـت و پـارەی پێدەیت، سەد هێندە زیاتر دێنێ.

بەڵام کاتێ کە دیقەت لە ئاخاوتنە تونـدەکانی بـدەیت، ئـەبینی کـە چ ئـیعلان حەڕبێکـە کردوویەتی، بەتایبەت کاتێ کە باس لە شوێنکەوتوانی فەلسەفەو موتەکەللیمین دەکات، یان کە باس لە تەئویل و تەعتیل ئەکات، ئـەبینین کـە ناونیشـانێکی زۆر زبـرو قـوڕس و توونـدو تـوون بـەکار ئـەهێنێ، ئـەبینین لـە نـاوەڕۆکی ئـەو باسـانە زەبـری زۆر توونـد ئەوشـێنی و پشـتی خراپکـران پـێ ئەشـکێنێ. یـەکێك لـە ناونیشـانەکانی بریتییـە لـە (الصَّواعِقُ الْمُرْسَلَة على الْجَهْمِيَّةِ والْمُعَطِّلَةِ) واتە: هەورەتریشقەی هـاتوو بۆسـەر جەهمیـەو موعەتتیلەکان. یان ناو نیشـانی (اجتماعُ الجيوش الإسلامية على غزوِ المعطلــة والجهميــة) واتە: کۆ بوونەوەی سوپای ئیسـلامی بـۆ شـەڕکردن لەگـەڵ موعەتتیلـەو جەهمییـەکان. بەمشێوە کتێبەکانی شێخ لە ناوکو ناوەڕۆکەوە هاوکۆکی یەکتر بوو ون.

**هەڤدەیەم**: دووپاتبوونـەوەی شـتەکان لـە نووسـینەکانی. کەسـێك کـە کتێبـەکانی (ابـن القـیم) بخوێنێتـەوە، ئـەبینیت کـە لـە بابەتێکـەوە هێنـدێ قسـەیەك کـە کردوویـەتی لـە زۆربــەی زۆری کتێبــەکانی دووپاتبوونەتــەوە. جــاری وا هەیــە دوپاتبوونــەوەیان بــە ئاخاوتنێکەوەیە، یان لە ڕووی ماناوەیە بەبێ ئەوەی ڕێککـەوتنێك لـە نێـوان ئاخـاوتن و دەستەواژەکە هەبوویێت.

ئەمەو لە زۆربەی مەسەلە فیقهییەکان یان تەفسیرەکانیشیەوە هەر وابووە.

شێخ ئەبو بەکر ئەبو زێد، ئەڵێت: هێنـدێ لـە نووسـەرەکان ڕەخنـە لـەو شـێوازەی (ابـن القیم) دەگرن، بەڵام لە ڕێگەی پشکنین و تێڕامانێکی ورد، ئەمە ئاشکرا ئـەبێت کـە ئـەم باسە نە جێگەی ڕەخنـە لێگرتنـەو نـە جێگـەی گلـەو گازاندەیشـە، بگـرە ئـەوە ئاشـکرا

ئەبێت، کە نووسینەکانی شێخ جیا کردنەوەیەکی جوان و شی کردنەوەیەکی ڕێزدارو پلەدارو پایە دارە.

شێخ ئەبو بەکر هۆکاری ئەو دووپاتبوونەوەی شتەکان لە نووسینەکانیدا ئەگێڕێتەوە بۆ:

١. زۆر جێی مەترسی بوون و گرنگبوونی ئەو بابەتەی کە (ابن القيم) هەڵیدەبژێرێت، وا لە شێخ ئەکات زۆر دووپاتیان بکاتەوە.لەوانە:

۞ دەربارەی حەرامبوونی گوێگرتن لە گۆرانی و زەرەرو زیانەکانی ئەم نەخۆشیە شەیتانییە.

۞ کێشەی تەلاقی سێبەسێ بە یەك دەستەواژە.

۞ فێڵە دەروونییەکان و حوکمەکانی، وە ڕوونکردنەوەیان لە باری حەرامییانەوە.

وە هەروەها باسەکانی تریشی هەر وەترن.

٢. هێندێ جار دووبارە بوونەوەی شتەکان، لەبەر سوودمەند بوونیی خەڵکەکەیە پێیەوە، بۆیە بۆ سوودی شتەکان جاری وا هەیە ئەچێتە نێو باسێکەوەو لە باسە بنەڕەتییەکە ئەپچڕێ و ئەچێت قسە لە هێندێ شت ئەکات و ئینجا ئەگەڕێتەوە سەر بابەتە بنەڕەتییەکە، ئەمەش بۆ ئەوەی ئەم سوودانەی کە لە بابەتە بنەڕەتییەکە وەر ئەگیرێن، موکوڕە لەسەر ئەوە کە خوێنەران پێیەوە سوود مەند ببن.

٣. هێندێ جاران بۆ کورتکردنەوەی ئەو بابەتەی کە دەستی داوەتێ، هەڵدەسێت شتێك دەوێدا دووبارە ئەکاتەوە کە لە شوێنی تردا جارێکی تر نووسیویەتی، ئەمەش زیاتر وا لە خوێنەر ئەکات کە ڕێگاکەی بۆ کورتتر بێتەوە، تا زووتر بگات بە تێگەیشتنی لە بابەتەکە.

بۆ نموونە لە کتێبی (بدائع الفوائد)دا لە باسی (حب)دا، ئەڵێت: بەمەندە لە کورتی ئەیبڕێنینەوە، بەڵام ئەبینین لە کتێبی (التحفة الْمَكِّيَّة)دا چەندین جارو زۆر بە دەوڵەمەندی دێت لە باسی موحەببەت تێهەڵدەچێتەوە.

یان ئەبینین لە کتێبی (مفتاح دار السعادة) دا کە دێت باس لە کیمیا ئەکات و ئەڵێت: **ئەمەو فەسادی و خراپەکەیمان لە چل ڕووەوە لە نووسینێکی تایبەتدا خستۆتە ڕوو..**

بەمەندە ئەبینین لە کتێبی (مفتاح دار السعادة) کۆتایی بە باسی کیمیا هێناوە.

٤. لایەنێکی تر لە سوودەکانی ئەم دووپاتبوونەوەی باسەکان لە کتێبەکانیدا، ئەوەیە

که ئەگەر کەسێك وە بەر هێندێ لە بابەتەکانی شێخ ڕانەگات، یان چنگی نەکەوێت، ئەوا شێخ وای بۆ ئاسانکردووە، کە ئەو کەسە بتوانێت لە کتێبێکی تریدا قەرەبووی ئەم بابەتە لەدەستچووەی بکاتەوە.

## کتێبەکانی شێخ

بێگومان هیچ زانستێك نییە له زانسته جۆراو جۆرەکان کە شوێندەستی (ابن القیم) ی پێوە دیار نەبووبێت! بە جۆرێکن ئەوەی هامڕایە یان ناکۆکە لەگەڵی سوود لە زانستەکانی وەر ئەگرن.

**هێندێکیش لە کتێبەکانی (ابن القیم) بە ڕەحمەتبێت، ئەمانەی خوارەوەن:**

١. اجتماع الجيوش الإسلامية على غزو المعطلة والجهمية.

٢. أحكام أهل الذمة.

١. إعلام الموقعين عن رب العالمين.

٢. إغاثة اللهفان من مصائد الشيطان.

٣. بدائع الفوائد.

٤. تحفة المودود في أحكام المولود.

٥. تهذيب مختصر سنن أبي داود.

٦. الجواب الكافي، **ناسراو بە** (الداء والدواء).

٧. جلاء الأفهام في الصلاة والسلام على محمد –صلى الله عليه وسلم– خير الأنام.

٨. حادي الأرواح إلى بلاد الأفراح.

٩. حكم تارك الصلاة.

١٠. الرسالة التبوكية.

١١. روضة المحبين ونزهة المشتاقين.

١٢. الروح.

١٣. زاد المعاد في هدي خير العباد.

١٤. شفاء العليل في مسائل القضاء والقدر والحكمة والتعليل.

١٥. الصواعق المرسلة على الجهمية والمعطلة.

١٦. طريق الهجرتين وباب السعادتين.

١٧. الطرق الحكمية في السياسة الشرعية.

١٨. عدة الصابرين وذخيرة الشاكرين.

١٩. الفروسية.

٢٠. الفوائد.

٢١. الكافية الشافية في الانتصار للفرقة الناجية ، **كه بريتييه له** "القصيدة النونية

٢٢. الكلام على مسألة السماع.

٢٣. مدارج السالكين بين منازل إياك نعبد وإياك نستعين.

٢٤. مفتاح دار السعادة ومنشور ولاية أهل العلم والإرادة.

٢٥. المنار المنيف في الصحيح والضعيف.

٢٦. هداية الحيارى في أجوبة اليهود والنصارى.

٢٧. الوابل الصيب في الكلم الطيب.

## وەفاتکردنی

**دوای ئەو ژیانە پرشنگدارو بە پیتەی کە لە جیهادو خەبات و تێکۆشانیدا هەیبوو، دوای ئەوەی کە تەمەنی گەشتە شەست ساڵ، ئەم کەڵە پیاوە زیندووە لە بەرواری شەوی پێنجشەممە و سێزدەی مانگی ڕەجەب، لە ساڵی (٧٥١)ی کۆچی لە کاتی بانگی نوێژی خەوتنان، لە دیمەشق وەفات ئەفەرموێ. تەرمی پیرۆزی بۆ نوێژ خوێندن لەسەری ئەبەن بۆ مزگەوتی** (الأموي)، **پاشانیش بۆ مزگەوتی** (جرَّاح).

## ڕێو ڕەسمی به خاکسپاردنی شێخ

**چونکە (ابن القيم) بە ڕەحمەتبێت، پیاوێکی هەق ویست و هەق بێژو ڕاگەیەنەری هەق بوو و ڕاست گۆ بوو لەگەڵ پەیامەکەی، هەر بۆیە حەشاماتێکی زۆر لە خەڵکی دیارو پیاو چاکان بەگشتی و تایبەت ئاپۆرەیان لە تەرمەکەی دابوو، خەڵکی لەسەر هەڵگرتنی**

تەرمەکەی کێشەیان بوو، دەگێڕنەوە کەوا لە هەموو دیمەشق تەنها سێ کەس دوای تەرمەکەی نەکەوتبوون، دەنا کەس لەماڵ بە جێ نەمابوو و دوکان و بازار گشتی داخرا بوون!

ئیمام ئەحمەد (ڕەحمەتی خوا لێبێت)، دەڵێت: بڵێن بەوانەی کە ئەهلی بیدعەن (بيننا وبينكم الجنائز). نێوان ئێمەو ئێوە تەرمەکانە. واتە: بزانن کە ڕاستیی و نا ڕاستی لەمڕێو ڕەسمەی بەخاکسپاردنی شێخ وەدیار ئەکەوێت، کە ئەو خەڵکە چەندی تامەزرۆی شێخ بوو ون، دە هێندە تامەزرۆی هەقبێژییەکەیین کە هەقبوو، بۆیە خەڵکی لەسەر هەڵگرتنی تەرمەکەی خەریکن تێکدەئاڵێن.

بە ڕەحمەت بێت، تەرمی پیرۆزیان لە تەك دایکی لە گۆڕستانی (الباب الصغير)دا بەخاکسپارد.

دەگێڕنەوە کە دوای وەفاتکردنی (ابن التيمية)، (ابن القيم)خەونی پێوە بینیوە کە لێی پرسیوە: پلەو بەرزیت لای خوا چۆن بوو؟ ئەڵێت: ئەویش قامکی بۆ پلەی پیاو چاکان درێژ کرد و پاشان پێی گوتبوو: زۆری نەماوە تۆش بگەیت بە من! بەڵام تۆ ئێستا هاوپلەی (ابن خزيمة)یت، ڕەحمەتی خوای لێبێت!.

خوا بە بەهەشتی بەرینی شاد بکات و ئێمەش دەگەڵیدا لە بەهەشتی بەرین لە گەڵ پێغەمبەران و ساڵحان و خواناساندا کۆ بکاتەوە. (ئامین)

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين:

